زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ پێکڤە کارکرنێ



2

# ڕەوشتێ پێکڤە کارکرنێ

چیرۆک: فید براکاش

وێنە: هارفندەر مانکار



وەرگێڕان و ئامادەکرن:

دیان جەمیل

زنجیرا چیرۆكێن ئاڤاكرنا كەسایەتییا زارۆكی

# ڕەوشتێ پێكڤه كاركرنێ


چیرۆك: فید براكاش

وێنه: هارفندەر مانكار

وەرگێڕان و ئامادەكرن: دیان جەمیل

پێداچوونا زمانی: مسلم عسمەت



ژمارا سپاردنێ: 2179یا سالا 2016






كتێبخانا
جزیری
Viber
mob: 0750 4260269
mob: 0750 4588806
ناڤ ونیشانێ مه ل فیسبووكێ: كتێبخانا جزیری
دهوك - بەرامبەر پەیكەرێ ئەحمەدێ خانێ

# لێکڤەکرنا کاری

ل دەمێ وانەیا زانستێ، قوتابیێن پولا شەشێ سەرەتایی هەموو دگەل ماموستایا خوە شیلانی چوونە دناڤ باخچەی دا داکو ماموستا نیشان وان بدەت کا دێ چەوا ئەردی کێلن و گولان چینن. ماموستایێ گوتە قوتابیان دڤێت دەمێ هوون گولان دچینن، گول گەلەك ب ڕەخ ئێك ڤە نەبن داکو رۆناهیا ڕۆژێ بگەهیتە هەموو گولان.



نەسرین و سرود و کاوار بوونە گرۆپەك، ژبەرکو وان گەلەك حەز ژ وانەیا زانستێ دکر لەوڕا هەر ئێکسەر دەست ب کولانا ئەردی کر و ل دووڤ دا ئەو گولێن ماموستایی داینەڤ وان چاندن و ئاڤ ژی لێ ڕەشاند.



هەردیسان سیزار و سولین ژی پێکڤە بوونە گرۆپەك، لێ ئەو وەکی هەڤالێن خوە یێن دی د زیرەك نەبوون و گەلەك د هێواش بوون لەورا چ جهێن باش ب دەست وان نەکەفتن داکو گولێن خوە لێ بچینن، لێ هەر د وی دەمی دا هەرسێ هەڤالێن وان یێن دی کارێ خوە نێزیکی دوماهیێ کربوو.



پشتی هینگێ سیزاری گوتە سولینی دا بچینە لایێ دی یێ باخچەی بەلکی ل وێرێ هندەك جهێ ڤالاّ مابیت داكو گولێن خوە لێ بچینین لێ دەمێ چوینە وێرێ ژی دیت چ جهێن ڤالاّ نەماینە.



سولين چوو دەڤ هەڤالێن خوە داكو گولێن خوە دگەل وان بچينيت، لێ نەسرينيێ گوتێ ببورە

هەڤال چ جهێن ڤالا ل دەڤ مەژى نينن و مە گولێن خوە هەموو يێن چاندين.



سیزاری ژی پشتی کو ج جهێن ڤالاّ نەدیتین گەلەك بێزار بوو و ڕوینشتە خارێ ل ئەردی و د دلێ خوە دا گوت: مە گەلەك خوە گیرو کر لەوڕا ل دوماهیێ چ جهێن ڤالاّ بۆ مە نەمان.



سولینێ گوته سیزاری: هەڤالێن مە هەموو جهـ یێن کولاّین و چ جهـ بومە نەهێلاینە و نوکە دێ ماموستایا مە هێت و گازندان ژ مە کەت لەورا پێدڤیە ئەم بچینە دەڤ هەڤالێن خوە داخوازێ ژێ بکەین هندەك ژ ئەردێ خوە بدەنە مە.



سولینێ گوته کاواری: هەوە گەلەك ئەرد بۆ خوه پێ هەلگرتی و چ جهـ بۆ مە نەمایە لەورا پێدڤیە هوون هاریکاریا مە بکەن و هندەك ژ ئەردێ خوه بدەنە مە بەری کو وانەیا زانستێ ب دوماهی بهێت داکو ئەم ژی گولێن خوه بچینین. کاوار ل سەر ڤێ داخوازیا وان ڕازیبوو و بریار دا هندەکێ ژ وی جهێ وان وان کولاّی بدەنە سولینێ و سیزاری.



ل دووڤ دا هەردوو گرۆپان پێکڤە کارکر و هەر ئێکی گولێن خوە چاندن. پشتی ب دوماهی هاتنا وانەیا زانستێ، ماموستایا وان هاتە وێرێ و دیت هەر گرۆپەکی کارێ خوە ب دروستاهی بێ ئەنجام دای لەوڕا کەیفا وێ گەلەك پێ هات و دەستخۆشی لێکر.

## سەربوور

## دڤێت د هەموو کاران دا تو هاریکاریا هەڤالێن خوە بکەی



# كاركرنا پێكڤە

ئەڤرۆكە ڕۆژا دوماهیێ یە ژ سالا خاندنێ و كەیفا قوتابیان گەلەك یا هاتی ب هەلكەفتا هاتنا بێهنڤەدانێ.



داڤین و هاڤین هەردوو هەڤالێن ئێك بوون ل قوتابخانێ. ڕۆژەکێ ل دەمێ وان وانەیا هونەرێ هەی داڤین زووتر هاتە د پولێ ڤە و چاکیتێ خوە ب دیواری ڤە هەلاویست داکو دەست ب کێشانا وێنەیەکێ بکەت.



هەردیسان داڤین و بارین و شرینێ ژی بریاردا بچنە دناڤ باخچەی دا و پێکڤە یاریا خوە ڤەشارتنێ بکەن. ل دەستپێکێ پێدڤی بوو داڤین ل بەر چینگێ ڕاوەستیت و بارین و شرین ژی بچن خوە ڤەشێرن.



دەمێ بارین و شیرین چووینە دناڤ باخچەی دا خوە ڤەشێرن، پێ داڤینێ کەفتە سەر وێ تەپێ یا هەڤالێن وێ یاری پێ دکر و پیپچەك مابوو بکەڤیتە سەر ئەردی لێ ئەو شیا کونترۆلێ ل سەر خوە بکەت و نەکەڤیت.



هەر گرۆپەکی یاریا خوە ب ئێمناهی ئەنجام ددا، لێ پشتی هینگێ ژ نیشکەکێ ڤە هەکاری پێهنەکا ب هێز ل تەپێ دا و تەپە چوو ب شیرینێ کەفت و ئێکسەر شیرین کەفتە سەر ئەردی.



شیرین ڕابوو ڤە و خوە تۆڕە کر و گوتە کورکان: هوون بوچی ناچنە جهەکێ دی بۆ خوە یاریێ بکەن؟

لێ هەکاری گوتێ: ئەم یێ ل ناڤ گۆرەپانێ و ئەڤە جهێ مەیە لێ پێدڤیە هوون بچنە جهەکێ دی یاریێ بکەن.



ل وی دەمی داڤێن و بارین ژی گەلەك تۆڕە بوون وگوت ئەڤ گورەپانە جهێ مە هەمیانە ڤێجا بوچی ئەم ژ ڤێرێ بچین. لێ شڤانی گوتێ ئەم ب تنێ دێ ل ڤێرێ یاریێ کەین چونکی ئەم بەری هەوە یێن هاتینە ڤێرێ.



ماموستایا وان گوهـ ل دەنگێ شەڕێ وان بوو لەوڕا هاتە دەڤ قوتابیان داکو بزانیت کا بوچی ئەو ژ هەڤدوو د تۆڕە نە و شەڕی دکەن.



ماموستایا وان گوتێ: نابیت هوون خوه تۆڕه بکەن چونكی ئەز دێ ڤی جهی ل سەر هەوە دابەش كەم و هەر گرۆپەك ژ هەوە دێ ل لایەكێ گورەپانێ یاریێ كەت چونكی ئەڤ گۆرەپانە یا مەزنە و تێرا هەوە هەموویان هەیە.



گرۆپێ کورکا گوته گرۆپێ کچکان: یاریا مە پێدڤی ب هندێ یە ئەم پێهنا ل تەپێ بدەین ڤێجا ئەگەر تەپا مە هاتە دەڤ هەوە دڤێت خوە تۆڕە نەکەن. کچکا ژی گوت بلا بەس هوون ژی ب هێز پێهنا ل تەپا نەدەن داکو زیانێ نەگەهینتە مە.



بۆ هندێ دووباره قوتابی هەڤرکیێ سەرا جهی نەکەن، ماموستایا وان هێلەك ل نیڤا گۆرەپانێ کێشا داکو هەر ئێك ژ وان نەچیته دناڤ جهێ هەڤالێن خوه دا.



پشتی ڤێ چەندێ هەکاری گوتە داڤینێ: ئەڤ چەندە باشترین چارەسەری بوو داکو تەپا مە نێزیکی هەوە نەبیت و هوسا گورەپان دێ تێرا مە هەموویان کەت و بێی تۆڕە بوون ئەم دێ یارییێن خوە ئەنجام دەین.



# سەربوور

## دڤێت د هەموو کاران دا تو هاریکاریا هەڤالێن خوە بکەی

